رۆژێك لەنێوان موهەلیب و عەتاب دەمەقاڵێ دروست بو و هەرکام بەتوندی لەگەڵ ئەویتر قسەی کرد. موهەلیب قامچی هەڵگرت تا لەسەری عەتاب بدات، کوڕەکەی موغەیرە کوڕی موهەلیب لەشوێنەکەی هەستا و قامچیەکەی لەدەستی باوکی دەرهێنا و وتی: خوا فەرماندە لەسەر چاکەکاری بهێڵێتەوە! پیرێك لەپیرەکانی عەرەب و گەورەیەك لەگەورەکانی ئەوانە. ئەگەر وتارێکی ناپەسەندت لەو بیستوە، باری قورسی ئەو بەسوکی هەڵبگرە چونکە شیاوە بۆ ئەم کارە. موهەلیب رازی بو و ئەم دوانە لەیەك جیابونەوە. عەتاب کەسی بۆ لای حەجاج رەوانە کرد و سکاڵای لەموهەلیب کرد و داوای کرد فەرمانی گەڕانەوەی بدات. ئەم کارە لەگەڵ نیازی حەجاج لەبابەتێکی تایبەت یەکی دەگرتەوە کە لەگەورەکانی کوفە سەبارەت بە کاری شەبیب نارەزامەند بو. ئەو عەتابی گەڕاندەوە و فەرمانی پێدا لەو سوپایەی کە لەژێر دەستی موهەلیبدایە خۆی بەدور بگرێت و بۆ لای خۆی (حەجاج) بگەڕێتەوە. موهەلیب کوڕەکەی خۆی حەبیبی کردە فەرماندەی ئەو سوپایە.

سوراقە کوڕی مێرداسی بارقی لەپرسەی عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف وتی:

| | |
|---|---|
| ثوی سید الازدین ازد شنوءة | و ازد عمان رهن رمس بكازر |
| و ضارب حتى مات اكرم ميتة | بابيض ضاف كالعقيقة باتر |
| و صرع عند التل تحت لوائه | كرام المساعي من كرام المعاشر |
| قضى نحبه يوم اللقاء ابن مخنف | و ادبر عنه كل الوث داثر |
| امد و لم يمدد فراح مشمرا | الى الله لم يذهب باثواب غادر |

یانی: سەرومری دو تیرە لەخەڵکانی ئەزدی عەممان و ئەزدی شنونە لەکازەرون سەری خستە ژێر خاك. بەشمشێرێکی سپی و تیژ و بڕەر وەك ئەڵماس شەڕی دەکرد و تێدەکۆشا تا پیاڵەی گیانبەخشی هەڵدا. لەداوێنی تەپۆڵکە لەژێر ئاڵاکەی ئەو پیاوانێکی تێکۆشەر کوژران. کوڕی مێخنەف لەرۆژی شەڕ بەرێگەی خۆیدا رۆشت و هەر داوێن پیسێك لەهاوکاری کردنی ئەو بەجێما. هاوکاری کەسانیتری کرد بەڵام ئەوان فریایی نەکەوتن و لەبەر ئەمە بەسەربڵندیەوە رۆشتە دیداری خواوەند و بەجل و بەرگی خراپەکاران نەرۆشتە بارەگاکەی ئەو.

موهەلیب لەشاپور مایەوە ویەك ساڵ لەوێ شەڕی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا صاڵح کوڕی موسەرەح یەکێك لەپیاوانی ئەمرۆئەلقەیس کوڕی زەید کوڕی مەنات لەتەمیم، کەوتە جموجۆڵ. ئەو لەسەر باوەڕی (صوفەریەکان) بو. یەکەم کەس لەم دەستەبو کە هاتەدەر. ئەو بۆ لای حەجاج بەرێکەوت و شەبیب کوڕی یەزید و سوەید و بەتین و کەسانیتر هاورێیەتیان دەکرد.

ئایینی حەج لەم ساڵەدا عەبدولەلیك کوڕی مەروان ئەنجامیدا. شەبیبی خارجی بڕیاریدا بەشێوەیەکی لەناکاو بیکوژێت. ئەم هەواڵە بەعەبدولەلیك گەیشت. دوای گەڕانەوە نامەی بۆ حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی نوسی وفەرمانی پێدا شوێن پێیان هەڵبگرێت. پیرەپیاوێکی چاکەکار و شیاوبو. دەهاتە کوفە وبۆ ماوەی یەك مانگ دەمایەوە و سەردانی هاورێکانی خۆی دەکرد و نیازەکانی بۆ دابین دەکردن. کاتێك حەجاج بەدوایدا گەڕا، لەکوفەدا جێگەی نەبویەوە و بەجێی هێشت.

کاتێك حەجاج بۆ حەج ڕۆشت، ڕۆشتە مەدینە و قسەی بۆ خەڵك کرد و دوای سوپاس کردنی خوا وتی: ئەی خەڵکینە، من نەخەلیفەی هەژار، عوسمانم، نەخوێنسارد و ئاشتی خواز وەك معاویە و نە باوەڕ سست وەك یەزید. ئاگادار بن من ئەم ئۆمەتە تەنیا بەشمشێر دەهێنمە سەر ڕێگەی راست تا داری ڕمەکەی ئێوە راست ببێتەوە. ئێوە کاری یەکەمی کۆچکەرانی خۆا باس دەکەن و شانازی بەوان دەکەن و چاوەڕوانی هەڵس و کەوتێکی هاوشێوەی ئەوانن لەئێمە، بەڵام کردارتان وەك ئەوان نیە. داوای خۆپارێزی لەئێمە دەکەن و خۆتان خۆپارێز نین. سوێند بەخوا چیتر کەس داوای خۆپارێزی و خوا پەرستی لەمن ناکات مەگەر ئەوەی بیکوژم. دواتر تەختی وتاردانی بەجێهێشت.

لەم ساڵەدا عرباز کوڕی ساریەی سولەمی (لەهاوەڵانی صوفە) مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەشام و لەکاتی ئاژاوەی کوڕی زوبەیر مرد. هەروەها لەم ساڵەدا ئەسوەد کوڕی یەزیدی نەخەعی برازای عەلقەمە کوڕی قەیس مرد.